# مافەکانی ژن و مێرد لە سەرچاوە گشتیەکان و ئاسۆیی دا



# لەسەر یەکتری لە ئیسلام دا

ئامادەکردنی:

پ. ی. د. کمال صادق یاسین لەك

مامۆستا لە کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان

زانکۆی صلاح الدین - هەولێر



٢٠١٦ زایینی - ١٤٣٧ کۆچی - ٢٧١٥ کوردی

# مافەکانی ژن و مێرد لەسەر یەکتری لە ئیسلام دا

ئامادەکردنی:

پ. ی. د. کمال صادق یاسین لەك

مامۆستا لە کۆلێژی زانستە ئیسلامیەکان

زانکۆی صلاح الدین – هەولێر

٢٠١٦ زایینی ـ ١٤٣٧ کۆچی ـ ٢٧١٥ کوردی

ناوی کتێب : مافەکانی ژن و مێرد لەسەر یەکتری لە ئیسلام دا

ئامادەکردنی: پ.ی.د. کمال صادق یاسین لەك

بەرگ : عزالدین محمد عمر

دیزاین: عزالدین محمد عمر

ساڵی چاپ : ٢٠١٦ ز - ١٤٣٧ ك

تیراژ : (١٠٠٠) دانە.

چاپخانەی هێڤی - هەولێر



لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٨٧٥)ی ساڵی (٢٠١٥)ی پێ دراوە

# پێشەكی

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمـد لله رب العالـمين والصلاة والسلام على نبينـا محمـد وعلى آله وصحبه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين، وبعد:

شتێكی ڕوونو ئاشكرایە كە تاك بەشێكە لـە خێزانو، خێـزانیش بەشێكە لە كۆمەڵگاو پایەیەكی سەرەكی هەیـە، وە ئەگەر تاك بـریتی بێت لە بەردی بناغەی كۆشكی كۆمەڵگا ئـەوا خێـزانیش خانەیـەكی زینـدووی ئەو كۆشكو بیـنایەیە.

جا ئەگەر خێزان چـاك بـوو ئـەوا تـاكیش چـاك دەبێـت، ئەگـەر تاكیش چاك بوو خێـزانو كۆمەڵگـایش چـاكو بەختـەوەر دەبـن، لەبەر ئەوەیە ئاییـنی ئیسلام گرنگی زۆرو چاودێریەكی تایبـەتی داوە بەبابـەتی خێـزان وخێزانــداری، وە هاتنایـەكی زۆری بڕیارەكـانی قورئان وسونەتی داپۆشیوە، وە لە نیشانەكانی بایەخ دانی ئیسلام بە خێزان ئەم بەرنامەو بڕیارانەیە كە ئیسلام دایڕشتوون بـۆ ڕێكخسـتنی

خێـزان و ڕێکـوپێکـکردنی کاروبارەکـانی و، دیـاریکردنی ئـەرك و مافـی سـەرجەم ئەندامانی خێـزان.

خــوای گــەورە دەفــەرموێت: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾الروم، واته: لە نیشانەکانی بوون و دەسەڵاتی خوا ئەوەیە: کە لە ڕەگـەزی خۆتـان هاوســەری بــۆ دروســت کــردون تــا لــە باڵیانــدا بحەسێنەوە و خۆشەویستی و میهرەبانیشـی خسـتۆتە نێوانتـان بۆئـەوەی بتـوانن پێکەوە بژین، بۆیـە نێر و مێ یەکتریتان خۆشدەوێ، ئەمەی کـەخودا کردوویەتی چەندین نیشـانەی گـەورەیی و توانـایی خـودای تێدایـە بۆهەر کۆمەڵـە ئادەمیزادێك کە بیر لەشتان دەکەنـەوە.

ئەو خۆشـەویستیەی لە نێوان هەردوو هاوسەر دایە پێناچێت بەم شێوەیە لە نێوان دووکەسی تردا هەبێت، خوای گـەورە حـەزدەکات هەمیشـە بـە سـۆز و بـە بـەزەیی بـن بـۆ یەکتری، هـەردەم یـەکتریان خۆشـبوێت، بۆیـە خـوای گـەورە حـەق ومـافی بـۆ هەریەکـەیان دیـاریکردوە بـەجۆرێك تـاکو پارێزگـاری و بـەردەوامی بـدات بـەو خۆشەویستی و ڕەحمەتـە بۆئەوەی لەناو نەچێت، وە دیاریکردنی ئەو

مافانە تەرازویەك دەداتە هەردوو لا (پیاو وئافرەت) بۆ ئـەوەی بـزانن هەروەكو ئەو مافانەی هەیانە بەسەر یەكتری یـەوە لـە بەرامبەریشـدا كۆمەڵـە ئەركێكیـان لەسـەر شـانە دەبێـت بـۆ هاوسـەرەكەی جێبـەجێـی بكەن.

بۆیە پیاوی مسوڵمان دەبێـت چـاك بزانێـت كـە ژنەكـەی مـافی بەسەریەوە هەیە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿... وَلَهُنَّ مِثْلُ ٱلَّذِى عَلَيْهِنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ... ﴿٢٢٨﴾﴾ البقـرة، واتـە: بۆئافرەتان هەیـە بەسـەر مێردەكانیانـەوە وەك ئـەوەی كـەبۆ پیـاوان هەیـە بەسـەر ئافرەتەكانیانەوە، كەواتـە ئافرەتـان هـەروەك ئـەركیان لەسـەرە ئەوەندەش مافیـان هەیـە.

پێغـەمبەریش ﷺ دەفەرموێـت: ﴿ألا إن لكـم علـى نسـائكم حقـا ولنسـائكم علـيكم حقـا﴾. {رواه الترمـذي وابـن ماجـه}، واتە: ئێـوە چۆن مافتـان لەسەر ژنەكانتـان هەیە، ئـەوانیش حـەقو مافیان هەیە لەسـەر ئێـوە، بەڵام بەداخـەوە زۆرێك لـە موسـڵمانان لە ژیـانی ڕۆژانـەیـان تەنهـا باسـی حـەقو مافـی خۆیـان دەكـەن بەبێ ئەوەی بزانن یا هەست بكەن كە ئەوانیش كۆمەڵـە ئەركێكیـان لەسەر شانەو دەبێـت ئەنجـامی بدەن لە بەرامبەردا.

ئاشکرایە یەکێك لە بەشە گرنگەکانی ئاین ئامۆژگارییە، بۆیە زۆر بە پێویستی دەزانم بابەتی: (مافەکانی ژن و مێرد لەسەر یەکتری لە ئیسلام دا) ڕوون بکەمەوە بۆ شارەزابوونو ڕێنمایی و هۆشداری ئایینی، وەك بەبیرهێنانەوە بۆ پیاوو ئافرەتی ئیماندار، تاکو هەردوو لا بزانن کە چ هەقو مافێکیان هەیە بەسەر یەکتریەوە تا ئەنجامی بدەنو، گرنگی ئەم بابەتە ئەوەیە کە زۆر لە کوڕو کچانمان هاوسەرگیری دەکەن بەلاّم بەبێ ئەوەی هیچ لە بابەتی مافو ئەو ئەرکە شەرعیانەی سەرشانیان بزانن بۆیە دواتر دەبینین کە زۆر لەو خێزانانە تووشی کێشەو ناخۆشیو ئەنجامی زۆر خراپ دەبن.

تێبینی: ئەو ئەرك وهەق ومافانەی کە باسیان دەکەین زۆرن و بەکورتی ئاماژەیان پێدەکەین هەموویان لە ژێر ڕۆشنایی ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانی پیرۆزو فەرمایشتە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە، بەلاّم لەبەر درێژ نەبوونەوەی نامیلکەکە زۆربەیان تەنها واتاو ماناکەیان وەردەگرین لە دەقە پیرۆزەکان بە تێگەیشتنی گەورە زانایانی شەریعەتی ئیسلام، وە بابەتی ئەم نامیلکەیە پێکهاتووە لە دووبەش:

بەشی یەکەم: مافەکانی ژن لەسەر مێردەکەی.

بەشی دووەم: مافەکانی مێرد لەسەر ژنەکەی.

لە مافەکـانی ژن لەسـەر مێـردەکەی ئەمانەی خوارەوەن:

## ١- ڕەفتـارکـردن بە چـاکە:

دەربارەی ڕەفتارکردن لەگەڵ ئافرەتان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ...﴾ (١٩) النساء، واتـە بەچاکـە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن، دەربارەی هەڵسوکەوت کردن لەگـەڵ خێزاندا پێغـەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: ﴿خیرکم خیرکم لأهله، وأنا خیرکم لأهلي﴾. {رواه الترمذي وابن ماجه}، واتـە: (باشترینتان باشـترینتـانە بۆ هاوسەرەکەی و منیش باشترینتـانم بـۆ هاوسـەرەکانم).

## ٢- مافی مارەیی پێدان:

مارەیی مافـی ئافرەتە بەسەر مێردەکەیەوە، وە بە تەنهـا موڵـکی خۆیەتی، مەگەر بە ئارەزووی خۆی بیەوێت بیدات بە کەسێکی تـر خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗۚ ...﴾ (٤) النساء، واتە: مـارەیی ئافرەتـان بـدەن بـە دڵ فراوانـی و ئاسـوودەییەوە.

تێبینی: لە ئیسلام مارەیی وەكو خەڵاتێكی گران بەهایە بە ئافرەت دراوە كە هەموو ماناكانی سۆزو خۆشەویستی و پەیمانی پێكەوە ژیانی هەتاهەتایی لەخۆ دەگرێت.

## ٣- دابینكردنی شوێنی حەوانەوە (نشینگە):

لەسەر پیاو واجبە كە شوێنێكی شایستەو گونجاو بۆ ژیانی هاوسەرگیری ئامادە بكات، كە گیان و شەرەفی هاوسەرەكەی پارێزراو و ئەمین بێت، پێداویستیە بنەڕەتی و گرنگەكانی تێدا بێت، وە بەگوێرەی دەسەڵات و توانای دارایی پیاوەكە بێت، جا مەرج نیە موڵكی خۆی بێت یا سەربەخۆ بێت، یا لەگەڵ كەسوكاری پیاوەكەشی بێت ئەگەر ئافرەتەكە ڕازی بوو، بەداخەوە زۆربەی گرفتەكانی خێزانی لەم خاڵە ڕوو دەدات.

## ٤- مافی نەفەقەو پارە بۆ سەرفكردن و هەڵسەوكەوتكردن بە چاكە:

ئەمەش بریتیە لە پێویستیەكانی ژیان، وە لەوەی ژن پێویستیەتی، وەك خواردن و خواردنەوەو جل وبەرگ و خزمەتكردن و خەرجی چارەسەری نەخۆشی و پێویستیەكانی تر.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : ﴿ولهن عليكم رزقهن وكسوتهن بالمعروف﴾ {رواه مسلم} ، واتە: ڕزق و ڕۆزیو جلوبەرگی ئافرەتان لەسەر ئێوەیە پێویستە دابینی بکەن بە شێوەیەکی باشو بەگوێرەی عورفوعادەتی ئەو شوێنەو توانای دارایی پیاوەکە.

## ٥- جێبەجێکردنی ئەو مەرجە شەرعییانەی کە ژن لە گرێبەستی مارەبڕین دایناوە :

پێویستە لەسەر مێرد وەفاداربێت بەرامبەر مەرجەکانی ژنەکەی کە لە کاتی مارەبڕین بڕیاری لەسەر دراوە، عوقبەی کوری عامر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إن أحق ما أوفيتم من الشروط أن توفوا به ما استحللتم به الفروج﴾ {متفق عليه} ، واتە: (شایستەترینو هەقترین مەرج لەوانەی کە پێویستە لە بەرامبەریدا ئێوەی پیاوان بە وەفابن هاتنەدی ئەو مەرجانەیە کە ژنان بەهۆیەوە شویان پێکردوون)، بۆنموونە ئەگەر ئافرەتەکە تەواوکردنی خوێندنی بە مەرج گرتبێت ئەوە مەرجێکی دروست و گونجاوە دەبێت پیاوەکە پابەند بێت بەو مەرجەو ئاسانکاری بۆ بکات.

## ٦- فـێرکـردن :

پێویـــــتە پیـــاو خــەخۆری لایــەنی زانســتیو ڕۆشـــنبیری هاوسەرەکەی بێت، بەوەی کە پێویـــتیەکانی کاروبــاری ئایینـــی تایـەت بە ژنانی فێــربکات لەگــەڵ بیروباوەڕی ڕاســتو زانـینی فەرزەکان، وە پێویستە مێرد زانیاریـەکانی نوێــژوو ڕۆژوو بابــەتی ســوری مانگـــانەی ئـافرەت بزانێـت تـا بتوانێـت هەڵســوکەوتی دروست لەگەڵ هاوســەرەکەیدا بکـات، وە پێویـــــتە حوکمـەکانی عـادەو نەخۆشـیی فێــری هاوسـەرەکەی بکـات، ئەگــەر بــەخۆی نەیـدەزانی دەبێـت ڕێگـەی بـدات لـەلای مامۆسـتای شـارەزا فێــر بکرێت ـ با مەسرەفو خەرجیشـی تـێ بچێـــت ـ یـا دابـین کردنـی هۆکارەکانی فێربوون وەك: کتێب و سیدی...هتد، بۆ خێزانـەکەی پەیدا بکات.

## ٧- دادپەروەری :

ئەگەر پیاوەکە زیاتر لە خێزانێکی هــەبوو واجبـە دادپــەوەری لــە نێوان ئــەو ژنـــەو هەوێکــەیدا بکـات، پێویـــــتە دادپـەروەری لــە نێوانیانــدا بکــات لــە خــواردنو خواردنــەوەو جلوبــەرگو شــوێنی

نیشتەجێبوون‌و شوێنی نوستن‌و مانەوەو سەفەرو سەردان...هتد، نابێت زوڵم‌و زۆرداریان لێ بکات‌و ناعەدالەتی ئەنجام بدات، چونکە خوای گەورە زوڵم‌و زۆرداری حەرام کردووە.

## ٨- پێویستە پیاو نهێنی هاوسەرەکەی بپارێزێت و بڵاوی نەکاتەوەو عەیب‌و نەنگیەکانی باس نەکات :

لە مەترسیدارترین نهێنی نهێنیەکانی سەرجێی بە بۆیە پێغەمبەر ﷺ ئاگاداری توندی داوە لە قەدەغەکردنی بڵاوکردنەوەو باسکردنی، وەك دەفەرموێت : ﴿إن من اشر الناس عند الله منزلة يوم القيامة : الرجل يفضي إلى المرأة وتفضي إليه ثم ينشر أحدهما سر صاحبه﴾، {رواه مسلم}، واتە: خراپترین کەس لە ڕوی پلەو شوێنەوە لەلای خوا لە ڕۆژی قیامەت پیاوێکە دەچێتە لای خێزانەکەی‌و خێزانەکەی دەچێتە لای‌و لە دواییدا هەر یەکەیان نهێنی ئەوی تر ئاشکرا دەکەن.

## ٩- پێویستە مێرد شەرەفی ژنەکەی بپارێزێت لە هەموو ئەوانەی کە دەبنە هۆی لەدەستدانی ڕێزو ڕەوشت جوانی :

پێویستە پیاو هانی خێزانی بدات تا فەرمانەکانی خوای پەروەردگار جێبەجێ بکات، وەدەبێت هاوسەرەکەی بپارێزێت لە هەموو ئەو شتانەی کە تووشی گوناح و بێ شەرعی دەکات، وەك سفوری و خۆدەرخستن و تێکەڵاوبوونی ناپێویست لەگەڵ کەسانی نامەحرەمدا، وە پێویستە هەموو مافەکانی بۆ دابین بکات و چاودێری بکات و ڕێگە نەدات بە لەناوچوون و لاوازبوونی ئایین و ڕەوشتە جوانەکانی و دەرچوون لە فەرمانەکانی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ، چونکە مێرد سەرپەرشتیارو بەرپرسە، وە پاراستن و پارێزگاریکردنی لە ڕەوشتە جوانەکان و بەهابەرزەکان ئەرکی سەرشانیەتی، وە دەبێت لەسەر ڕەوشتە جوانەکانی ئایین پەروەردەی بکات.

**١٠- پێویستە مێرد ڕێگر نەبێت لە چوونە دەرەوەی ژنەكەی بۆ كاری پێویست و سەردانی خزم و كەسوكاری :**

لە بەرامبەر ئیزنی پیاوەكە پێویستە ئافرەت لە چوونە دەرەوەی نەبێتە هۆی فیتنە بۆ كەسانی تری بەردەرخستنی جوانیەكانی، دەبێت دەرچوونی بێ خۆڕازاندەوە بێت، وە خۆی دوور بگرێت لە بۆنی عەترو گوڵاوو سۆراو سپیاو، تەوقەكردن لەگەڵ كەسانی بێگانەدا یان گوێ گرتن لە خراپە، وە پێویستە پارێزگاری لە خۆی بكات و بەئاگا بێت لە بەكارهێنانی چاوو زمان و دەست و دڵ و هەستی، وە خۆی دوور بگرێت لە دانیشتن لەبەر دەرگای ماڵ و ئازاردانی خەڵكی بە زمان و هەڵسوكەوتی ناشیرین.

**١١- پێویستە مێرد یارمەتی هاوسەرەكەی بدات بۆ فێربوون و جێبەجێكردنی ئاینەكەی و پارێزگاری كردن لە نوێژو ئەركە ئاینەكانی :**

بە تایبەتی نوێژە فەرزەكان و فێركردنی نوێژ و ڕۆژووە سوننەتەكان، وەك نوێژی چێشتەنگاوو نوێژی ویترو شەو نوێژو

تەوبەکردنو پارێزگاری کردن لەسەر خوێندنی دوعاو ئەو زیکــرو وێردانەی لە پێغـەمبەرەوە ﷺ هاتوون، خوای گەورە دەفـەرموێت:

﴿ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَا ﴿١٣٢﴾ ﴾ طه.

واتە: فەرمان بـە خێزانەکـەت بکــە بـە نوێـژکردن و بـەدەوام بـە لەسەر ئەم فەرمانە کە لەکـاتی خۆی ئەنجام دەدرێت.

## ١٢- پێویســتە مێـرد لـە کارەکانـدا ڕاوێــژو پـرس بـە ژنەکەی بکـات:

یەکێکـی تر لە مافەکــانی ژن بەســەر مێردەکەیەوە ئەوەیـە، کـە پرسو ڕای پێـبکات لە کـاروبارە تایبـەتییـەکانی خێـزان بە تایبـەتی ئەوانەی پەیوەندی بە خۆیو منداڵو کاروبـاری ماڵەکەیـەوە هەیـە، یـان هەر بابەتێـك کە بزانێـت خێزانەکـەی ووردو بیـر تیـژە تێـدا، ئەم کارەش ئـەنجام دەدرێـت بەپشـت بەسـتن بـە سـونەتو نـەریتی پێغـەمبـەر ﷺ کە هەمیشــە پـرسو ڕای بـە ژنـەکانی دەکـردو ڕای ئەوانیشــی وەردەگـرت، وەك لە صـەحیحی موســلیم دا هـاتووە: لەکاتــی نووسـینی (صـلح الحديبيـة) کاتێـك پێغـەمبــەر ﷺ بـە یـارانی فـەرموو: " قوربانیەکانتـان سەربڕن و سـەرتان بتراشـن"،

بەڵام هیچ کەسێك ئەم فەرمانەی یەکسەر جێبەجێ نەکرد، جا پێغەمبەر ﷺ چووە لای ( أم سلمة) خێزانیو ڕووداوەکەی بۆ گێڕاوە، (أم سلمة) ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ هەڵسە لەپێش چاوی ئەوان قوربانییەکەت سەر ببڕەو سەری خۆت بتراشە، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا بەقسەی (أم سلمة)ی کرد، پاشان هاوەڵان کە ئەمەیان بینی، ئەمانیش هەموان هەڵسان ئاژەڵەکانی خۆیان سەربڕیو سەریان تراشی، ئەمە نموونەیەك بوو لە ڕاوێژی پێغەمبەر ﷺ بە خێزانەکانی کە دیارە خێرێکی چەند گەورەی بەدوادا هات.

## ١٣- مێرد نابێت ژنەکەی لەماڵەوە جێبهێڵێت هەتا درەنگانی شەو بەبێ هۆکارێکی ڕەوا :

پێغەمبەرﷺ ڕێگری کردوە لەوەی پیاو لەکاتی درەنگی شەودا لەناکاو بێتە ناو ماڵ، وە ئەمەش مافێکی تری ژنە بەسەر پیاوەکەیەوەو پێویستە دوای نوێژی شێوان ڕاستەوخۆ بگەڕێتەوە لای، وە لە دەرەوەی ماڵی خۆیدا تا درەنگانێکی شەو نەمێنێتەوە مەگەر کارێکی زۆر زەروری هەبێت، چونکە ئەو ڕەفتارە ژن

بێزاردەکات‌و، وای لێدەکات هەست بە شڵەژان بکات‌و، ئەگەری گومانـــی ڕاڕایـــی دروســـت دەکـات، بەڕاســتی چارەســەری گرفتەکان بەقسـەکردن دەبێت نەك بـە شـاردنەوەو بـاس نـەکردنی، بە بەڵگـەی ئافرەتی ناشـیزە کە یەکـــەم هەنگــاو ئامۆژگارییـە، وە ئەم ئامۆژگارییەش لەوانەیە بە جارێـك‌و دووجـار بەرهـەمی نـەبێت بەڵکو بەردەوامی دەوێت‌و لێزانین‌و حیکمەتـی پێویـــتە.

## ١٤- مێرد نابێت سیخوڕی بەسەر هاوسەرەکەیەوە بکات:

پیاو نابێت بەگومان بێت بەرامبەر هاوسەرەکەی، خودای گەورە دەفــەرموێت: ﴿...وَلَا تَجَسَّسُوا...﴾ (١٢) الحجـرات، واتــە: سـیخوری بەسەر یەکتـرییەوە مەکـەن، جابر (ڕەزای خـودای لــێ بێـت) دەفــەرموێت: ﴿نهى رسول الله ﷺ أن يطرق الـمرء أهله ليـلا أو يخـونهم و يلـتمس عثـراتهم﴾ {رواه أحمـد وابـن حبان} ، واتــە: پێغـەمبەر ﷺ ڕێگـری کـردووە پیـاو لـە درەنگـانی شەودا لـەناکاو خـۆی بکـات بەناوماڵـدا بـە مەبەسـتی دەرخسـتنی ناپاکـی‌و دۆزینــەوەی هەڵـەو کەموکوڕییــەکانی هاوســەرەکەی،

بەڵێ پێویستە پیاو خەمسارد نەبێت لە سەرەتای ئەو کارانەی کە دەبنە جێی مەترسی بۆ بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەرگیری، بەڵام نابێت گومانی خراپ و ناڕەوای پێ نەبات، وە نابێت لە مەزەندەکاندا زیادەڕۆیی بکات و گومانی خراپ بە هاوسەرەکەی ببات بەبێ بنەماو بەڵگە، چونکە ئەم جۆرە گومانانە سەردەکێشێت بۆ ئەنجامی زۆر خراپ.

## ١٥- مێرد نابێت ژن بەجێ بهێڵێت و قسەو پەیوەندی لەگەڵدا ببڕێت و خۆی لێ دوور بگرێت:

بەبێ بوونی هیچ هۆکارو پاساوێك، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿... وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيۡهِنَّ ... ﴿٦﴾﴾ الطلاق، واتە: زیان مەگەیەنن بە هاوسەرەکانتان بۆ ئەوەی زیاتر ناچاریان بکەن و تەنگیان پێ هەڵچنن، زیان گەیاندن بە ژن چەندەها جۆری هەیە: لەوانە خۆ لێ دوورگرتن و قسە لەگەڵ نەکردن و پشت تێکردنە.

## ١٦- مێرد پێویستە جوێن نەدات و نەفرەت نەکات و توندوتیژی بەرامبەر هاوسەرەکەی بەکارنەهێنێت و دەستدرێژی نەکاتە سەری بە ناهەق :

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿...فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا...﴾ (٣٤) النساء، واتە : ئەگەر هاوسەرەکانتان گوێڕایەڵیان کردن ئیتر ئێوە ڕێگایەك بەیرەو مەکەن بۆ لێدانیان، وە زۆرداریکردن لێیان و دژایەتیان مەکەن، وەك ئەوەی سەرکۆنە بکرێت بە بەکارهێنانی دەستەواژەی نەشیاو وەك : جنێودان و قسەی ناشیرین پێکوتن و بێزلێکردنەوەو بەلەعنەتکردن و، تف لێکردن و هاوار لەسەرکردن... هتد .

چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ﴿لیس المؤمن بطعان ولا لعان ولا فاحش ولا بذيء﴾، [رواه مسلم] .

واتە : ئیماندار هەرگیز تانەدەرو نەفرەتکەرو قسەی سوكو ناشیاو بێ ڕەوشت و بێ ئەدەبی ناکات) .

## ١٧- مێـــرد پێویستـــە ئارامگـــر بێـــت لەگـــەڵ هاوسـەرەکەیدا :

دوای هاوسـەرگیری پیـاوان پێویستە ڕەچـاوی تێبینی شـێوازو سروشـتی ئـافرەت بکــەنو لەگەڵیانـدا نـەرمیو سـۆز پـەیرەوی بکــەنو هەڵســوکەوتی تونـدوتیـژییــان بەرامبــەر نەکــەن، وەك وەفایـەك بـەو هەقــەی هەیـەتیو لەپێنــاو مانــەوەی پەیوەنــدیی خۆشەویستیی نێوانیــانو پارێزگــاری کـردن لـە ئاســودەییو مانــەوەی خێـزان، پێغـەمبــەر ﷺ دەفەرموێــت: ﴿ لا یفرك مؤمن مؤمنة إن كره منها خلقا رضي منها آسخر ﴾ {رواه مسلم} ، واتــە: نابێــت پیـاوی ئیمانــدار ڕقو قینــەی هــەبێت بەرامبـەر ئافرەتی ئیماندار ئەگەر لە ڕەوشـتێکی ڕازی نـەبوو ئــەوا ڕەوشـتێکی تـری بەدڵــەو ڕازی دەکـات، بەتایبـەتی لـە هەنـدێك حــاڵەت وەك : کاتی بێـنوێـژی و نەخۆشـی کە دووچاری گرفـت دەبێـت پێویســتە لەسەر پیــاو ڕەچاوی بـاری دەروونـی خێــزانی بکات.

## ١٨- مێرد دەبێت هەمیشە هاوسەرەكەی خۆشبوێت و ووتەی شیرینی لەگەڵ بەكاربهێنێت و بەردەوام ڕوی خۆشبێت لەگەڵیدا :

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت : ﴿ الكلمة الطيبة صدقة ﴾ {رواه مسلم}،واتە: قسەی شیرین و جوان و باش خێرو چاكەیە، كەواتە ئەگەر ووشەی جوان و شیرین بۆ خەڵكی بەگشتی ئەوها خێر بێت، بێگومان لەگەڵ هاوسەرەكەی زیاتر خێرو چاكترە، وە دەبێت دەستخۆشی لێبكات لەسەر كارەكانی وە لە كەموكورپیەكانی ببورێت، بەتایبەتی لە دروستكردنی چێشت ونانی، لە صەحیحی موسلیم دا هاتووە كە پێغەمبەری خودا ﷺ : ﴿ ماعاب رسول الله صلى الله عليه و سلم طعاما قط، كان اذا اشتهى شيئا أكله وان كرهه تركه﴾. واتە : هەرگیز پێغەمبەری خودا ﷺ عەیبی لە هیچ خواردنێك نەگرتووە – وەك بڵێ ئەمە سوێرە، یا بێ خوێیە، یا نەكوڵاوە – ئەگەر حەزی لێبكردبایە دەیخوارد، ئەگەر حەزی لێنەكردبایە وازی لێ دەهێنا بەبێ عەیب لێگرتن.

## ١٩- پێویستە پیاو هەڵسوكەوتەكانى لەگەڵ خزمەكانى هاوسەرەكەیدا باش بێت :

مافێكى ئافرەت بەسەر پیاوەكەیەوە ئەوەیە: كە هەڵسوكەوتى لەگەڵ باوك و دایكى خێزانەكەى و خزمەكانى باشبێت، پیاو چاكەى لەگەڵ ژنەكەى نەكردوە، ئەگەر لەگەڵ باوك و دایكى ژنەكەى یان خزمەكانى باش نەبێت، پێویستە پیاو زۆر رێز لە كەسوكارى ژنەكەى بگرێت، بەتایبەت دایكى خێزانى (خەسوو)، چونكە ئەو دایكە زۆر زۆر ماندو بووە بە كچەكەى و پەروەردەى كردوەو شەونخونى زۆرى بۆ كردوە، تا ئەم ئەمانەتەى رادەستى ئەو پیاوە كردوە بۆیە دەبێت پیاویش ئەم چاكەیە قەت لەبیر نەكات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿من لم یشكر الناس لم یشكر الله﴾. {رواه الترمذي وابوداود} . واتە: ئەو كەسەى كە سوپاسى خەڵك نەكات وە چاكەى خەڵكى لەبەر چاو نەبێت، ئەوە سوپاسى خواى گەورەشى نەكردوە.

## ٢٠- مێرد دەبێت کە هاتەوە ماڵەوە سڵاو لە هاوسەرەکەی بکات :

سڵاوکردنی پیاو لە ژنەکەی ئەرکەو یەکێکە لە سیفەتەکانی ئادەمیزادی دڵ نەرم، سڵاوکردن هێمای ئاشتی و هێمنی و ئارامی و دوور بوونە لە شەڕو ئاڵۆزی و گرژی.

ئەنەس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ ئامۆژگاری کردم و فەرمووی: ﴿إذا دخلت على أهلك فسلم يكن بركة عليك وعلى أهل بيتك﴾ {رواه الترمذي}، واتە: ( هەر کاتێك چویتەوە بۆ لای کەسوکارەکەت سڵاو بکە، چونکە دەبێتە مایەی ڕژانی بەرکەت بەسەر تۆو بەسەر خاوو خێزانی ماڵەکەت.

## ٢١- مێرد پێویستە چارەسەری سەرپێچی و لە ڕێ لادانی هاوسەرەکەی بە چاکە چاك بکات :

لە مافەکانی ژن بەسەر مێردیەوە ئەوەیە پەروەردەی بکات و هانی بدات بۆ گوێڕایەڵیکردن، پێویستە مێرد پلە بەندی بکات لە جێبەجێکردنی ئەم گوێڕایەڵییەدا، سەرەتا بە پێشکەشکردنی

ئامۆژگاری‌و قسەی خۆش، پاشان ئاگادارکردنەوە، ئەگەر ئەوە چارەسەری نەکرد با سەرجێی لەگەڵ نەکات‌و پشتی تێبکات، یان بە تەنیا لەسەر جێگاکەی بە جێی بهێڵێت، ئەمانە هەتا سێ ڕۆژ ئەنجام بدات، ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو، با هەڕەشەو چاوسوورکردنەوەی لەگەڵ بکات، وە بیترسێنێت بە سزای خودا، ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو، ئەوە بۆی هەیە تەمبێی بکات، ئەگەر بە پێویستی زانی وە سوودی هەبوو، بەڵام تەمبێکردنێکی توند نا، وە دەبێت زۆر سووك‌و سنووردار بێت، وە نابێت برینداركردنی تێدا بێت، وە دەبێت دوور بێت لە دەم‌وچاو بە هەموو شێوەیەك، نابێت ئاسەواری بەجێ بمێنێت، وە نابێت ئەم کارە لە پێش چاوی کەس بێت، بەڵكو لە ماڵەوە لە شوێنێکی داخراو بێت بۆ ئەوەی دەروون‌و کەسایەتی لەکەدار نەکات‌و، نابێت قسەی سووك‌و ناشیرینی پێ بڵێت، یان بەکەسوکاری.

بۆیە خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: ﴿ ولا تقبح ولا تهجر إلا في البيت ﴾ {رواه أبوداود}، وە پێغەمبەری خودا ﷺ هەرگیز لێدانی بەکارنەهێناوە لەگەڵ هاوسەرو خێزانەکانی وە لە هیچ ئافرەتێکی نەداوە قەت قەت، وە خۆشەویست ﷺ

فەرموویەتی: ﴿ دارەکەت بەرز نەکەیتەوە لە هاوسەرەکەت بە سزای خودا بیترسێنە﴾ {أخرجه البخاري في الأدب المفرد}.

## ٢٢- دەبێت پیاو یارمەتی خێزانەکەی بدات لە کاروباری ماڵەوەی وەك ئیقتیداکردن و چاولێکردنی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ:

﴿عن الأَسْوَدِبن يَزِيدَ، قَالَ: سَأَلْتُ عائشةُ -رضي الله عنها- مَاكَانَ النَّبيُّ يَصْنَعُ فِي بَيْتِهِ؟ قالت: كَانَ يَكُون في مِهْنَةِ أهْلِهِ- يعني: خِدمَة أهلِه - فإذاحَضَرَتِ الصَّلاةُ، خَرَجَ إلَى الصَّلاَةِ﴾ {صحيح البخاري}، جاء ذلك مفسرًا في بعض الروايات: ﴿كان في بيته، ويحلب شاته، ويرقع ثوبه، ويخصف نعله، ويخيط ثوبه ويرقع دلوه، ويخدم نفسه، ويعلّف ناضحه، ويعقل البعير، ويأكل مع الخادم ويحمل بضاعته إلى السوق﴾ {رواه أحمد وابن حبان والبخاري في الأدب المفرد}، ئەم هاوەڵە بەڕێزە الأَسْوَدِبن يَزِيدَ (ڕەزای خوای لێ بێت) دەڵێت: پرسیارم لە دایکمان عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کرد: ئایا پێغەمبەری خوا لە ماڵەوە چی دەکرد؟

گوتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە یارمەتی کاروپیشەی هاوسەرەکانی خۆی دابوو، ئەگەر کاتی نوێژ هاتبایە یەکسەر ئامادەی نوێژ دەبوو لە مزگەوت، وە لە ماڵەوە شمەکی خۆی چاك دەکردو ڕێکی دەخستو بەدەستی خۆی مەڕی دەدۆشیو نەعلو پێڵاوی خۆی چاك دەکردەوە، پۆشاکەکەی دەدوورییەوەو پینەی دەکردو، سەتڵی ماڵەکەشی چاك دەکرد، وە خزمەتی خۆی دەکردو، ئالیکی دەدا بە ووشترەکەیو بەخۆی دەیبەستاوەو، لەگەڵ خزمەتکارەکەی خۆی نانی دەخواردو کەلوپەلەکانی خۆی بەدەستی خۆی هەڵدەگرت بۆ بازار، دیارە پێغەمبەری خودا ﷺ مامۆستاو پێشەواو پێشەنگە بۆ پیاوانی موسڵمان لە یارمەتیدانی هاوسەرەکانیان، بەتایبەتی لەکاتی نەخۆشکەوتنی ئافرەتو بێتاقەت بوون دا.

بەڵێ بەڕاستی دەبێت مێرد یارمەتی ژنەکەی بدات لە پێویستیەکانیدا بەگوێرەی توانا، چونکە یارمەتیدان خۆشەویستی پێکەوە ژیان دروست دەکات، دیارترین سیفەتی ژیانی هاوسەریتی یارمەتیدانە لە سەر خێرو چاکە بۆ ئەوەی ژیانی خێزانی بۆ ئاستێکی بەرز رابێت، کە بەو هۆیەوە خۆشگوزەرانی

بۆ خێـزان‌و منداڵان دێتـە ئاراوە، نابێـت مێرد تەنها لەكـاتی خۆشی لەگەڵ خێزانەكەی بێت، بەڵكو دەبێـت لـەكاتی نەخۆشـكەوتنیشی لەگەڵ ئازارەكانی بژیت‌و لێی ڕانـەكات‌و، پشـتگوێـی نـەخات، چـونكە ئـەم ئافرەتـە زیـاتر لەوكاتـە دژوارانـەدا چـاوی لەدەسـت‌و ڕەفتاری پیاوەكەیـەتی، بـە یارمەتیـدانی زۆر دڵخـۆش دەبێـت، وە لەوانەیـە هۆكـاری چـاكبوونەوەو شـیفا بۆهـاتنی بێت، بـەڵام كـە دەبینـی پیاوەكەی لێـی بێـزارە ئـاوڕی لێنـاداتەوە، ئەگـەر چـەند نەخۆش بێت لەوانەیە زیاتر نـەخۆش بكـەوێت بـە خـەم‌و خەفـەت خواردن، بۆیــە دەبێت پیـاو بەڕاسـتی زۆر وەفـادار بێـت بەرامبـەر هاوسـەرەكەی خۆی.

تێبینـی: دیارە یارمـەتی پیـاو بۆ خێزانەكەی لە ماڵێـك بۆ ماڵێكـی تر دەگۆڕێ، بۆ نــموونە: ئـەو ئافرەتــەی ژنـی ماڵـە جیـاوازە لەگەڵ لەو ئافرەتـەی دەوامی هەیـە، یا منـداڵی زۆرە یەكێكی تر منداڵی كەمـە...هتد، گرنگ ئەوەیـە پیــاو سـەیری هاوسـەری نـەكات بـە چـاوی خزمـەتكارو ئـەویش وەك كوێخـا، بـەڵكو هەردوولا هاوسـەرو هاوكـارو هاوخـەمی یەكتر بن.

مافی مێـر لەسەر ژنەكـەی مـافێكی گەورەیـە، دەبێـت ئـافرەت بەرامبەر مێردەكـەی ئەنجامی بدات، وەك زۆرێك لە فـەرموودەكانی پێغەمبەر ﷺ ئاماژەیان پێكردووە. پێغەمبەری خودا ﷺ موژدەیەكی زۆر خـۆش دەدات بـە ئـافرەتی موسـڵمانی چـاكو گوێڕایــەڵ بـۆ پیـاوەكەی كە دەفـەرموێت: ﴿ أیمـا امـرأة مـاتت و زوجهـا عنهـا راض دخلت الجنة ﴾ {رواه الترمذي}. واتـە: هـەر ئافرەتێـك بـمرێت ومێردەكـەی لێـی ڕازی بێت دەچێتـە بەهەشت.

لەو مافانەی مێرد لەسەر ژنەكەیـەتی ئەمـانەی خوارەوەن:

**١- دەبێت ژن گوێڕایەڵـی تەواوی مێردەكەی بكات لـە هەموو كـارە ڕەواكـانـدا:**

واتە: مـادەم گونـاه نـەبێت كارەكـە دەبێـت بەقسـەی پیاوەكـەی بكـات، خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ...﴿٣٤﴾﴾النساء، واتـە: پیــاوان مافــی سـەرپەرشــتیان هەیـە بەسـەر ئافرەتانـدا، ئەمـەش بڕیـاری خـوای گەورەیــە، القوامە: واتە سـەرۆكایەتی خێـزانو مافـی گوێڕایـەڵی.

فـەرموودەی زۆر هاتووە لە پێغــەمبەرەوە ﷺ کـە باسـی فـەزڵو گەورەی ئـافرەت دەکـات کاتـێ گوێڕایـەڵی پیاوەکەیـەتی، لەوانـە فـــەرموودەی: ﴿ اذا صـلت الـمرأة خمسـها وحصـنت فرجهـا وأطاعت بعلها دخلت من أي أبواب الجنـة شاءت ﴾، {رواه ابـن حبـان} ،واتـە: ئەگەر ئافرەت پێنج نوێژەکـەی کـردو داوێنـی پـاك ڕاگرتو گوێڕایەڵی پیـاوەکەی کرد، دەچێتە ناو بەهەشت بـە کـام دەرگـا بیەوێتو ئـارەزوو بکات).

پێویـستە ئافرەت لە قسەی پیاوەکەی دەرنەچێت مـادام داواکـەی پێچـەوانەی شەرع نەبێت، بەڵام هـەر کاتێـك پیـاو داوای کـارێکی ناشەرعی کرد ئـافرەت نابێت گوێڕایەڵی بێت، چـونکە گوێڕایـەڵی تـەنها لـە کـــاری چاکەدایــــە، چــونکە پێغـــەمبەری خــودا ﷺ دەفەرموێت: ﴿ لا طاعة لـمخلوق فـي معصية الخـالق ﴾ {رواه أحمد} ، واتە: گوێڕایـەڵی بۆکەسێك نیە ئەگـەر ئـەو کەسـە داوای سەرپێچـی خودا بکـات.

__ڕوونکردنـەوەیەك__ : دەربـارەی دەسـەڵاتی پیـاو بەسـەر ژنانـەوە، وە مانـــای (القوامـة) ڕوونکردنەوەیــەك پێویـــــتە کـــە خـــوا

دەفـــــەرموێت: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ ...﴿٣٤﴾﴾ النساء ، واتە: پیـاوان مافـی بەڕێوە بـەرێتیان بەسـەر ئافرەتانـەوە هەیـەو دەبێـت چـاودێرییان بكـەنو ئافرەتـانیش دەبێـت بـەپێی پـلانو نەخشـەی ئەوان ڕەفتـار بكەن.

مانـای (القوامة) مانای بەكۆیلـەكردنی ژن نیـە بۆپیـاوان (وەك هەندێك كـەس وادەڵێـــن)، بەڵكو (القوامـة) دیـاریكردنی ئـەركو دەسـەڵاتی پیـاوە بەرامبـەر ئـافرەتو ئـەركو تەكلیفێكــە خراوەتـە سەرشـانی پیـاوان بـۆ ژنـــان، وە ئەمــە ڕێنمــاییەكی خودایـە بـۆ ڕێكخستنی كاروباری خێزان، كە دەبێت پیاو زۆر بەچـاوی ڕێـزەوە ئەو خێزانەی كە ئەمانەتەو ڕاسپاردەی خوایە لەچاوی خـۆی باشـتر بپارێزێت، گشت مافەكانی دابین بكـات، وەك خـانووو خـواردنو خـۆراكو جلوبـــەرگو دەرمـانو لـە سـەرماو گەرمــاو برسـیەتی، تینـوێتی بیپـــارێزێت، زۆر بـەكورتی دەتـوانین بڵـێین: ئـەم پلـەو دەسەڵاتەی كە بە پیاو دراوە ئەرك لەسەرشـانبوونەو بەرپەرســبوونە (مسؤلیة وتكلیف) نەك بـە زیـاد دانـانی پیاوانـە بەسـەر ژنـان، وە قیوامە سەرپەرشـتیاریـیە نەك ستەمكاری، چونكـە ئاشكرایە دەبێـت خێزان بەڕێوەبـەرو چـاودێرێكی هەبێـت بۆئەوەی ئیشــوكارەكــان

بە ڕێکوپێکی بەڕێوە بچێت، نەك ببێتە ئاژاوەو تێکگیرانو، دیارە لاشەو جەستەی پیاو توندو تۆڵترو بەهێزترە لە ژنان بۆیە ئەرکی ماڵو دارایی‌و ئازوقە پەیداکردنو مارەیی‌و بژێوی‌و خێزانکاری قورسی دەرەوەی ماڵ لە ئەستۆی پیاوە، چونکە پێکهاتەی لاشەی پیاو شیاوترو گونجاوترە بۆ ئەم ئەرکو بەرپرسیارەتییە.

## ٢- نابێت ژن خۆی قەدەغە بکات لە مێردەکەی هەر کاتێك داوای سەرجێی لێ کرد :

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ إذا باتت المرأة هاجرة لفراش زوجها لعنتها الملائكة حتى ترجع﴾ {رواه البخاري}، واتە: ئەگەر ژنێك سەر جێگای مێردەکەی بەجێهێشت ئەو ئافرەتە فریشتەکانی خوا لەعنەتی لێدەکەن تا دەگەڕێتەوە سەر جێگای مێردەکەی.

ئەو ژنەی لەو کارەدا بێ هیچ پاساوێك‌و بێ عوزری شەرعی گوێڕایەڵی مێردەکەی نەکات ئەو ژنە فریشتەکان لەعنەتی لێدەکەنو خوا لێی تووڕە دەبێت، نوێژەکانی وەرناگیرێتو،

بەرز نابێتەوە، وە مافی پەروەردگار بەجێ‌ناهێنێت‌و ئیمان‌و باوەڕیشی لاواز دەبێت، لەگەڵ ئەوەی پیاویش دەبێت ڕەچاوی حاڵەتی ماندووبوون‌و نەخۆشی‌و باری تەندروستی‌و دەروونی ئافرەتەكەی بكات.

## ٣- نابێت ژن خێر لە ماڵی پیاوەكەی بكات بەبێ ئیزنی ئەو:

پێویستە پارێزگاری لە ماڵی مێردەكەی بكات، بۆیە نابێت ژن لە ماڵ‌و سامانی مێردەكەی هیچ سەرف بكات تەنها بە ڕێپێدانی ئەو نەبێت، وە دەبێت دەست بڵاو نەبێت‌و زیادە مەسرەف نەكات، وە نابێت ئافرەت ببەخشێ لە ماڵی مێردەكەی، ئەگەر مێردەكەی ڕوخسەتی دابێ، نابێ ئافرەت ماڵی پیاوەكەی زیادە مەسرەف بكات، چ بە خواردن، چ بە جلوبەرگ، چ بە كەلوپەل، بەڵكو پێویستە پارێزگاریان لێ‌بكات، ئەگەریش ویستی شتێك بداتە هەژارێك، یا دەستكورتێك دەبێ ڕوخسەتی ئاشكرا لە پیاوەكەی وەربگرێت، یان ڕوخسەتی پێشوەختەی بۆ ئەم جۆرە كارانە

لـێ وەرگرتبێـت و بزانێت پیاوەکەی ڕازییــە، یـان نـا، ئەمــە بـۆ خێـر کردن حوکمی وایـە، بەڵام بۆ زیادە مەســرەف و بەهـەدەردانی ماڵـی پیـاوەکەی ئـەوا تـاوان و گوناهبــاربوونە.

## ٥- قەناعــەت هــەبوون و ڕازیبــوون بــەو داهاتــەی دەسـتی پیـاوەکەی دەکەوێت :

لـە هـەقی مێـرد لەسـەر ژن ئەوەیـە ڕازی بیـت بـەوەی هەیـەو قەنـاعەت بکات و لە مەسرەف کردندا زۆر پێداگری نـەکات کـە لـە تواناداد نەبێــت، داوای شـتێك نـەکات کـە پیاوەکـەی لەتوانــای دا نەبــێ، یان داوای شـتێك نـەکات کـە زیـادە بــێ و پێویستی پــێ نـەبێ، دەبێ ژیــانی هاوسـەر لەگـەڵ پیاوەکـەی بەپێــی دەرامـەت بژی، ڕازی بێ بەو ڕزقەی خـوا بۆیـانی ناردووە، نابێ زیـادەڕەوی بکات لە خواردن و جل وبـەرگ وکەلوپـەل، ڕازی بوون بـە توانـای پیـاوەکەی بەردەوام خۆشەویستی و ڕێزگرتن زیاد دەکات، لەزەت و تامــەزرۆی لــەژیانیان دەرنــاکــەوێ هــەمووی دەبێتــە خەنــدەو خۆشـیی، بـەڵام ڕازی نـەبوون بـە توانــای ئـابووری پیاوەکـەی، ئەگەر بە ئاماژەیـەکیش بێت ژیانیان جگە لە تەسکی و پەشـۆکاویی،

دەبێتە پارچەیەك لە تورەیی و لێك دوورکەوتنەوەو هەڵدێران، لە ئەنجام دا پیاو بۆ بەردەوامی ژیانیان پەنا دەباتە بەر حەرام، ئافرەتانی ئیماندارى پێشینە چاکەکان کاتێ پیاوەکانیان دەچوونە دەرەوە بۆ بازرگانی ئامۆژگاریان دەکردن و دەیانگوت: دەخیل ئێوە لە دەرەوەن و نەکەن پارووی حەرام بهێننەوە بۆ خۆمان و منالەکانمان، چونکە لەسەر برسیەتی ئارام دەگرین، بەڵام ئارام لەسەر ئاگر ناگرین، بەڵکو ئافرەتی ئیماندار دەبێ لەکاتی ناخۆشی و گرانی و کەم رِزقیدا پشتی پیاوەکەی بگری و دڵی بداتەوە، رەزامەندیی و ئارامگریی نیشان بدات، بۆ ئەوەی پیاوەکەی تووشی حەرام خواردن نەبێت، چونکە خوای گەورە

دەفەرموێت: ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴿٥﴾ ﴾الشرح، واتە: بەراستی لەگەڵ هەرناخۆشیی و نارەحەتییەك دواتر خۆشیی و رەحەتیەك هەیە، ئەمەش بزانین: راستە داوا لەئافرەت دەکرێت کە ئارام بگرێت لەسەر کەمدەرامەتی پیاوەکەی، بەڵام دەبێت پیاوەکەش کەمتەرخەم نەبێت لە ئیشکردن و هەوڵدان و خۆماندووکردن بۆ بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی بۆخۆی و خانەوادەکەی.

## ٦- ژن بە بێ ڕێپێدانی هاوسەرەكەی نابێت ڕۆژووی سوننەت بەڕۆژوو بێت :

یەكێكی تر لە مافەكانی مێرد بەسەر ژنەكەیەوە نابێت ژن هەر لە خۆیەوە بەڕۆژوو بێت بەبێ پرس و ڕێپێدانی مێردەكەی جگە لە مانگی ڕەمەزان، چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ﴿لا يحل للمرأة أن تصوم وزوجها شاهد إلا باذنه﴾ . {أخرجه البخاري} ، واتە: نابێت ئافرەت بە ئامادەبوونی مێردەكەی بەڕۆژوو بێت تەنها بە ڕەزامەندی و ڕێپێدانی ئەو نەبێت.

## ٧- ژن نابێت لە ماڵی هاوسەریدا ڕێ بە هیچ كەسێك بدات بێتە ناو ماڵ تەنها بە ڕەزامەندی هاوسەرەكەی نەبێت :

یەكێكی تر لە مافەكانی مێرد بەسەر ژنەكەیەوە كە نابێت كەسێك بێنێتە ناوماڵ و جێگای مێردەكەی بەبێ ڕەزامەندی خۆی، چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: ﴿فحقكم عليهن أن لا يوطئن فرشكم من تكرهون ولا يؤذن في بيوتكم

لمن تكرهون ﴾، {أخرجه الترمذي وابن ماجه}، واتە: مافی ئێوە لەسەر ژنان ئەوەیە ڕێگەنەدەن هیچ كەس بێتە ناو ماڵ و جێگاتان بەبێ ڕەزامەندی ئێوە.

## ٨- پێویستە ژن هەڵسوكەوتەكانی لەگەڵ خزمەكانی هاوسەرەكەیدا باش بێت :

مافی مێرد بەسەر ژنەكەیەوە ئەوەیە، كە هەڵسوكەوتی لەگەڵ باوك و دایكی مێردەكەی و خزمەكانی باشبێت، ئافرەت چاكەی لەگەڵ پیاوەكەی نەكردوە، ئەگەر لەگەڵ باوك و دایكی مێردەكەی یان خزمەكانی باش نەبێت، پێویستە ئافرەت مافی پیاوەكەی و خزمەكانی پێش بخات و، زۆر ڕێز لەكەسوكاری مێردەكەی بگرێت، بەتایبەت دایكی مێردی (خەسوو)، چونكە ئەو دایكەماندو بووە بۆ كورەكەی شەونخونی بۆ كردووە، ئافرەتی باش ئەو دایكە بە دایكی خۆی دەزانێ و بۆ ئیشوكاری ماڵەوە پرس و ڕاوێژی پێدەكات، وا لە خەسووی بكات چۆن بە چاوی پڕ خۆشەویستی سەیری كوڕەكەی دەكات زۆر زیاتر سەیری خێزانی كورەكەی بكات (بوكەكە)، چونكە جیاوازی و

دووبەرەکی لەگەڵ خەسووی زۆر جاران دەبێتە هۆی تێکچوونی گرێبەستی مارە بڕی‌و پێشێلکردنی مافی یەکترو زەرەرو زیانی گەورە لەدەستدانی ڕەزامەندی خوای میهرەبانە پەنا بە خوا.

## ٩- دەبێت ژن نهێنی مێردەکەی‌و نهێنی ماڵەکەی بپارێزێت :

فەرموودەی زۆر هەن، کە پێداگری لەسەر مافی مێرد لەسەر ژنەکەی دەکات‌و گرینگترینیان مافەکانی داپۆشین‌و پاراستن‌و بەردەوام بوونە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ﴿إن من اشر الناس عند الله منزلة يوم القيامة: الرجل يفضي إلى المرأة وتفضي إليه ثم ينشر أحدهما سر صاحبه﴾، {رواه مسلم}، واتە: خراپترین کەس لە ڕوی پلەو شوێنەوە لەلای خوا لە ڕۆژی قیامەت پیاوێکە دەچێتە لای خێزانەکەی‌و خێزانەکەی دەچێتەلای‌و لەدوایدا هەر یەکەیان نهێنی ئەوی تر ئاشکرا دەکەن.

## ١- دەبێت ئافرەت سەیری پیاوانی بێگانەو نامەحرەم نەکات بەبێ زەرورەت:

دەبێت ئافرەت خۆی داپۆشێ لە پیاوی بێگانەو چاوی خۆشی بهێنێتە خواریو بەرامبەریان جگە لە پیاوی خۆی، هەروەك واجبە لەسەر هاوسەرەکەشی، چونکە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ ... (٣١) ﴾ النور، واتە: بڵێ بە ئافرەتانی ئیماندار چاوی خۆیان لە سەیرکردنی پیاوی نامەحرەم داخەنو بپارێزن، وە عەورەتیان لە داوێن پیسی بپارێزن، هەروەها لە بەرامبەردا لەسەر پیاویش واجبە کە سەیری ئافرەتی بێگانەو نامەحرەم نەکات بەبێ کاری پێویستو زەرورەت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ... (٣٠) ﴾ النور، واتە: بڵێ بەپیاوانی ئیماندار چاوی خۆیان لە سەیرکردنی ئافرەتی نامەحرەم داخەنوبپارێزنو، عەورەتیان لە داوێن پیسی بپارێزن، بۆیە ئافرەتی باش دەنگی بەرز ناکات، تا پیاوی بێگانە گوێی

لـێبێ، یا خۆپێناسـاندن لەگەڵ برادەری پیاوەكەی ناكـات تـەنها بـۆ پێویسـتییەك نەبـێ، ئەگـەر پیاوەكـە ڕوخسـەتی دا، ئەگـەر پیاوەكەی لەماڵ نەبوو لـەكاتی لـە دەرگـەدانی برادەرەكـەی نەچێتە دەرێ بەڵكو پرسیار لە نـاوو كارەكـەی بكـات بـەبێ درێـژەدان، نابێت فەرمـووی لـێ بكات بـۆ ماڵـەوە مـادام پیاوەكـەی لـە مـاڵ نیە، بەڕاستی پێویستە ئافرەت خـۆی بپـارێزێت و داوێـن پـاكی خـۆی ڕابگرێـت و، كەسـایەتی و ڕێـزو شـەرەفی مێردەكـەی بپارێـزێت .

## ١١- پێشكەشكردنی هەموو جۆرەخزمەتێك كەلەتوانای دایە بۆ پیاوەكەی و میوانەكانی :

لەسـەر ئافرەتـە بەیـانی بكاتـەوە بـە جێبەجێكـردنی ئیشـوكارەكانی ماڵـەوە، چونكە پاكـكردن و پۆلینكردنی ناومـاڵ لاشـەو مێشـك بەهێـز دەكـات، وە ئـەم چالاكیـانە ئـافرەت لـە نەخۆشـی دوور دەخـات وەكـو پاككردنـەوەو گسـك لێـدانی ڕایەخـەكان و ئامـادەكردنی ژەمەكـان و دابینكردنـی ئـاوی ساردو ئاوی گـەرم ...هتد.

دەبێت ژن خزمەتى مێردو منداڵ و ماڵەكەى بكات : خواى گەورە دەفەرموێت : ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ ﴿٢﴾﴾ المائدة، واتە : هاريكارى يەكترى بكەن لەسەر كارى چاكەو خواپەرستى، پێشەوا عەلى (ڕەزاى خوداى لێ بێت) دەفەرموێت : فاطمة (ڕەزاى خوداى لێ بێت) سكالاَى كرد لەو بريناـنەى كە بەردەوام دەستى تووشى دێت بەهۆى زۆر بەكارهێنانى دەستاڕەوە، (چونكە دانەوێڵەى دەهاڕى وكارى دەكرد بۆ يارمەتى مێردەكەى و بەڕێوەچوونى ماڵەكەى، تادواجار هات بۆ لاى پێغەمبەر ﷺ و داواى خزمەت كارێكى كرد. {رواه البخاري}.

ئەسما (ڕەزاى خوداى لێ بێت) دەفەرموێت : (كنت أخدم الزبير خدمة البيت كله ، وكان له فرس ، وكنت اسوسه وكنت احتش له واقوم عليه و ارضخ له النوى)، {اخرجه احمد} ، واتە : من خزمەتى زوبێرى هەموو ماڵەكەيم دەكرد، ئەسپێكى هەبوو من كارەكانيم بۆ بەڕێوە دەبرد، واتە : بۆم زين دەكردو گيام دەخستە بەردەمى و بۆم ئامادە دەكردو ناوكە خورمام بۆ دەهاڕى.

## ١٢- ژن دەبێت منەت بەسەر مێردەکەیدا نەکات :

مافێکی تری مێرد بەسەر ژنەکەیەوە ئەوەیە، کە منەتی بەسەردا نەکات بەهۆی ئەو پارەیەی خۆی، کە سەرفی دەکات بۆخۆی و منداڵەکانی لە ماڵەکەیدا، چونکە منەتکردن پاداشت پووچەڵ دەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ ... ﴾ (٢٦٤) البقــرة، واتــە: ئــەی خــاوەن ئیمانەکــان خێرو چــاکەی خۆتــان بــەتاڵ مەکەنەوەو بەفیڕۆی مەدەن بەهۆی منەت کردنتان بەسەر ئەوانەی خێریــان پێدەکــەن و ئازاریــان دەدەن بــە گوتنــەوە باســکردنی خێرەکانتــان.

## ١٣- دەبــێ ژن مێردەکــەی هانبــدات لەســەر ئەنجامدانی چــاکەو دوورکــەوتنەوە لە خراپە :

ژن هــاوڕێ و شــەریکی مێردەکەیــەتی و پێویســتە چــاکترین کــەس بێت بۆ ئەو هــاوڕێیەتیــە.

ئـەبو هورەیـــرە (ڕەزای خـودای لـێ بێـت) دەگێڕێتـــەوە، کـە پێـغـــەمبەر ﷺ فەرمـوویـــەتی: ﴿رحـم الله امــرأة قامـت مـن الليـل فصلـت وأيقظـت زوجهـا فصلـى، فـان ابـى نضـحـت فـي وجهه المـاء﴾. {رواه ابو داود والنسائي}، واتـه: (ڕەحمــەتی خــودا لـەو ژنـەی کـە شــەو هەڵدەســتێت و نوێـژ دەکـــات و مێردەکـەی خەبەر دەکـاتەوە، ئەگـەر خەبــەری نــەبووەوە، یـان هەڵنەستا ئـاو دەپـرژێنێـت بەســەر دەموچــاویدا)، بـەڵام دەبێـت ئەم ئـاو پرژاندنـه بـه ئـاوێکی ئاسـایی و کـەم بێـت مەبەسـتی تـەنها هۆشیارکردنەوەی بێت و به نـەرمی و لەسەرخۆ بێـت.

## ١٤- دەبێــت ژن هـەڵسـوکـەوتی بـاش بێـت لەگـەڵ مێـردەکـەیدا و ئازاری نەدات:

ژن دەبێـت مێـردی خۆی خۆشـبوێـت و زۆر دڵـگران بێـت لـەو کاتانەی مێردەکەی له ماڵـەوە نیـەو، پارێزگاری لـێبکات له کـاتی ئامادەبوون و ئامادەنەبوونیدا، وە هەوڵبـدات تـا دڵخۆشـی بکـات و ناپاکی له داوێنـی خۆی و ماڵەکـەیدا نەکات و کەم قسـەبێت لەگـەڵ دراوسێکانیدا، وە پێویسـته ژن سـوپاسی مێــردەکەی بکـات و دان به چاکەکـانیدا بنێـت و سـتایشـی بکات.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ﴿لا ينظر الله إلى امرأة لا تشكر لزوجها وهي لا تستغني عنه﴾. {رواه النسائي والحاكم}، واتە: خوای گەورە تەماشای ئافرەتێك ناكات و ڕەحمی پێناكات كاتێك كە سوپاسگوزاری مێردەكەی نەبێت و بە چاكەكانی نەزانێت لە كاتێكدا كە پێویستی پێیەتی.

پێویستە ئافرەت بەردەوام دەستخۆشی لە مێردەكەی بكات لەسەر ئەو هەموو چاكانەی بەرامبەری دەیكات، چونكە پیاوانیش مرۆڤن لە ژیاندا هەڵە دەكەن، بەڵام هەندێ ئافرەتی ناتەندروست هەن، ئەگەر سەدان چاكەیان بەرامبەر بكرێت بەس یەك خراپەی بەدوابێ دەڵێن قەت چاكەم لە تۆوە نەدیوە، هەروەكو لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە: ئیبن عباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ كە فەرموویەتی: ئاگری دۆزەخیان پێ نیشان دام، دەبینم زۆرترین ئەوانەی كە تێیدان ئافرەتن، چونكە كوفر دەكەن، وتیان ئایا كافرن بە خوا (باوەڕیان بە خودا نیە)؟

فەرمووی: ناشوكرن بە مێردەكانیان، ناشوكرن بەو چاكانەی لەگەڵیاندا دەیكەن، ئەگەر لە هەموو ژیانت چاكە بكەیت

لەگەڵ یەکێکیان دا: ﴿ثم رأت منك شيئاً ، قالت: ما رأيت منك خيراً قط) پاشان شتێکی زۆر بچوکت لێ ببینێ (ئەو پێی خۆش نەبێ) دەڵێ: هەرگیز خۆشیم لە تۆوە نەدیوە.

**١٥- دەبێت ژن لەماڵی خۆی ئارام بگرێت و نەچێتە دەر ئەگەر بۆ مزگەوتیش بێت بەبێ ئیزنی مێردی :**

مافێکی تر لە مافەکانی مێرد بەسەر ژنەکەیەوە ئەوەیە کە نابێت تەنانەت بۆ مزگەوتیش لە ماڵەوە بچێتە دەرەوە تەنها بە ڕەزامەندی ئەو نەبێت، پێویستە ژن ماڵی خۆی زووزوو بەبێ هۆ بەجێ نەهێڵێت و نەچێتە دەر.

**١٦- دەبێت ژن خۆی برازێنێتەوەو خۆی جوان بکات و ڕوخۆش و بە زەردەخەنە بێت بۆ مێردەکەی و ڕوی لێ گرژ نەکات :**

لە مافی مێرد بەسەر ژنەکەیەوە ئەوەیە خۆی بۆ برازێنێتەوە، وە بە شێوەیەك خۆی نیشان نەدات ڕقی لێ بێتەوە، وە باشتر وایە ژن خۆی بۆ مێردەکەی بە کل و

بۆنی خۆش و گوڵاوو هەموو جۆرە خۆ ڕازاندنەوەیەك خۆی جوان بکات، کە پیاوەکەی حەزی لێیەتی تا پەیوەندی نێوانیان بە خۆشەویستی بەردەوام بێت، بەڵام کاتێ پیاوەکەی لەماڵ نیە، با بە خۆ دەرنەخستن و خۆ نەڕازاندنەوە بژی، جوانییەکانی بۆ بێگانە دەرنەخات، هەر کاتێك مێردەکەی هاتەوە با بە بۆنی خۆش و هەموو جوانییەکانی و پاکو خاوێنی بە دڵخۆشی و یاری و سوعبەت پێشوازی لە مێردەکەی بکات، بێگومان ئەم پێشوازییەو سۆزو خۆشەویستیە هەموو کێشەو ئازارو ماندووبونەکانی پیاوەکەی دادەماڵێ.

<u>ئاگاداری</u>: دەبێت پیاویش خۆی پاکوخاوێن و جوان بکات بۆ خێزانەکەی نەك پیس و پۆخڵ بێت، ئیمام ئیبن عباس (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: (إني أحب أن أتزين لامرأتي كما أحب أن تتزين لي)، واتە: بەڕاستی پێمخۆشە خۆم بۆ ژنەکەم جوان بکەم و بڕازێنمەوە، هەروەك پێمخۆشە ئەو خۆی بۆ من جوان بکات و بڕازێنێتەوە.

## ١٧- دەبێـــت ئـــافرەت هەســـتێت بـــە بـــاش پەروەردەكـردنـی ڕاسـتەوخۆی منداڵەكـانی:

چـــاك پەروەردەكردنـــی منداڵەكـــانی بـە ئـارامی دەبێـت، وە واباشــە تـوڕە نەبێــت لێـان لـەپێش چـاوی مێردەكـەی، نابێـت دوعـــایان لێبكـــاتو قســـەی ناشـیرین یـان جنێــویان پێــدات، چونكە ئـەو كارانـە دەبێتـە ئـازاردانی مێردەكەی، بـەڵكو پێویسـتە پەروەردەیان بكاتو خوارییەكانیـان بۆ ڕاست بكاتـەوە بە هـێمنیو قسـەی خـۆش، چونكــە پێغەمبــەری خـوا ﷺ دەفــەرموێت:

﴿كُلُّكُمْ رَاعٍ وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ الإِمَامُ رَاعٍ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالرَّجُلُ فِى أَهْلِهِ رَاعٍ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ وَالْمَرْأَةُ فِى بَيْتِ زَوْجِهَا رَاعِيَةٌ وَهِىَ مَسْئُولَةٌ عَنْ رَعِيَّتِهَا ﴾. {متفق عليه}،

واتــە: هەمووتـــان شــوانن‌و هــەمووتان بەرپرســن لــەوەی لــەژێر چاودێریتـان دایـە، پێشــەوا شـوانەو چــاودێرە بەســـەر ئەوانـەی لەژێـــر دەســـتەڵاتیدایە، وە پیـــاو شـــوانو چـــاودێرە بەســـەر خێزانەكەیــەوە، وە ئــافرەتیش شـــوانو چـــاودێرە بەســـەر مـــاڵو منداڵـەكانی مێردەكەیەوە، پێویســـتە مافــە دینییـــەكان بــە جــوانی جێبەجێ بكات: یەكەم شت لەسەر جێگـای نوستنو هەڵسـان بـۆ

نوێژی بەیانی جێبەجێ بكات، پاشان منداڵەكانی بانگ بكات بۆ نوێژو كار ئاسانی تەواو بكات بۆ پیاوەكەی بۆ ئەنجامدانی ئەم عیبادەتانە.

## ١٨- نابێت ژن باسی جوانی ئافرەتێكی بێگانە بكات بۆ مێردەكەی :

ئیبن مەسعود (خودا لێی رازی بێت) گێراویەتیەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ لا تباشر المرأة المرأة فتصفها لزوجها كأنه ينظر اليها﴾، {رواه مسلم}، واتە: نابێت ئافرەتێك ئافرەتێكی تر بە ڕووتی ببینێت، پاشان بۆ مێردەكەی باس بكات‌و وەسفی بكات، وەك ئەوەی بە چاوی تەماشای بكات .

## ١٩- نابێت ئافرەت بەبێ بەڵگەو هۆكاری شەرعیی داوای تەڵاق لە مێردەكەی بكات :

چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ أيما امرأة سألت زوجها الطلاق من غير بأس فحرام عليها رائحة الجنة ﴾، {رواه

الترمذي}، واتە: هەر ئافرەتێك داوای تەلاق لە مێردەکەی بکات بەبێ بوونی هیچ کێشەیەكو هۆکارێکی شەرعی ئەوە بۆنی بەهەشتی لێ حەرام کراوە.

دوا ووشە دەڵێم: پێویستە هەردوو هاوسەر (پیاوو ئافرەت) بزانن کە هەر دوولایان ئەمانەتی خودان لەلای یەکتری، وە ڕۆژی قیامەت خوای گەورە پرسیارو لێپرسینەوە لەگەڵ هەردووکیان دەکات دەربارەی ئەنجامدانی ئەرکەکانیان، وە وەرگرتنی مافەکانیان، چونکە لە دونیاو دوارۆژدا ستەمکارو کەمتەرخەم بە سزای تاوانەکانیان دەگەن، وە چاکەکارانیش لە هاوسەران پاداشتی چاکەی خۆیان وەردەگرنەوە.

بۆیە دەبێت تۆکمەیی خێزان بپارێزین‌و، نمونەی خێزانی بەختیار پێشکەش بە کۆمەڵگا بکەین، وە دەبێت هەردوو هاوسەر بۆ یەکتر هاوخەم‌و هاوژین‌و هاوڕێ بن‌و، ئەمانەش بە تەبایی‌و بەینخۆشی‌و محەببەت‌و ڕەحم‌و بەزەیی‌و ڕەچاوکردنی ئەرك‌و مافی یەکتری دەکرێ.

لە کۆتاییـدا : دوای خوێنـدنەوەی ئەم بابەتـە هیوادارم خوشـك‌و برایانـــمان ســوودی لـــێ وەربگــرن ، وە ئـەم ڕێنمـــایە جوانانـەی شەرعی پیرۆزی خـوا جێبـەجێ بکــەن‌و لـە ژیـانی خۆیـان ڕەنـگ بداتـەوە بۆئەوەی هــەموان بەختـەوەر بـن لـە دونیـــاو دوارۆژدا ، خوا کـاری خێر لە هـەموان قـبوڵ بکات.

وصـلى الله وسـلم ويـارك علـى نبينـا محمـد وعلـى آلـه وصحبه أجمعين ، وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.

# سەرچاوەکان

بعد القرآن الكريم.

١) صحيح البخاري .

٢) صحيح مسلم .

٣) سنن ابو داود .

٤) سنن الترمذي .

٥) سنن ابن ماجه .

٦) سنن النسائي.

٧) المستدرك للحاكم.

٨) مسند الإمام احمد بن حنبل.

٩) صحيح ابن حبان.

١٠) الفقه المنهجي على مذهب الإمام الشافعي، د. مصطفى الخن ،و د. مصطفى البغا ،و علي الشربجي.

١١) عشرة النساء للإمام ابي عبدالرحمن احمد النسائي.

١٢) الفقه الإسلامي وأدلته للدكتور الزحيلي.

١٣) الزواج في القرآن وصحيح السنة لملا محمد الشهرزوري.

١٤) الموسوعة الفقهية الكويتية.